

پرۆژەی فەلسەفە

پرۆژەی هاوبەشی بەشی فەلسەفەی زانکۆی سەڵاحەددین و دەزگای موکریانی

# توماس ئەکوینی
# رابەری فەلسەفەی سکولاستی

د. حەمید عەزیز

---

**پرۆژەی هاوبەشی بەشی فەلسەفەی زانکۆی**
**سەڵاحەددین و دەزگای موکریانی**

4


ناوی کتێب: **توماس ئەکوینی**

نووسینی: **د. حەمید عەزیز**

سەرپەرشتیی پرۆژە: **رێبوار سیوەیلی (بەشی فەلسەفە)**

سەرپەرشتیی کاروباری دەزگا: **دلێر سادق (دەزگای موکریانی)**

نەخشەسازی ناوەوە: **هاوڕێ ساڵح**

بەرگ: **ئاسۆ مامزادە**

ژمارەی سپاردن: (953)

تیراژ: **(1000) دانە**

چاپی یەکەم: (2009)

نرخ: **(1000) دینار**

چاپخانە: **چاپخانەی هاوسەر (هەولێر)**

# ناوەڕۆک

## پێشەکی

ئەگەر بگونجێ مێژووی فەلسەفە بەسەر چەند قۆناغێکدا دابەش بکرێت، ئەوا هەر ئەو قۆناغە لەلای خۆیەوە بە هۆی فەیلەسووفێکەوە یاخود بە هۆی چەند فەیلەسووفێکەوە سروشتی ئەم دابەش کردنە لەلای خۆیەوە دەردەخات. ئەگەر سوکرات فەلسەفەی یۆنانیی کردبێ بە قۆناغی پێش خۆی و دوای خۆی، ئەوا توماسی ئەکوینی (1224-1274ز) لەلای خۆیەوە پشکی ئەو دابەشکردنەی دراوەتە دەست و لە سەدەی سیانزەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا بە هۆی ئەو جیهاندیدیەی کە رەنگی رشتووە و بە فەلسەفەی ئەرستوتلیزمی مەسیحی ناودەبرێ، بە کۆتایی هاتنی قۆناغی پێش خۆی و دەستپێکی قۆناغێکی تر دادەنرێت.

توماسی ئەکوینی، لە جیهانی پسپۆڕانی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەو ناوە ناسراوە، توانیویەتی لە گێژاوی بەدکردنی ناوی فەلسەفەدا بە گشتی و بەدناوکردنی ئەرستۆ بە تایبەتی، جارێکی تر فەلسەفەی لەو گێژاوە هێنایە دەرەوە و وێنە تەڵخەکەی لە بارەیەوە کاڵ کردەوە و تا رادەیەك ئەو تەپ و تۆزەی لێتەکاند کە بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست - پێش خۆی — لێی نیشتبوو. فەلسەفەی ئەرستۆی جارێکی تر بە پێی هەلومەرجی سەردەمی خۆی رەواکردەوە.



ئەکوینی لە کایە و دەڤەری پەیوەندی نێوان لاهوت و فەلسەفە، ژیر و سروش، زانین و بڕوا، بەڵگە سەلمینەی بوونی رەب، مرۆڤ و نەفس و گیان، فەلسەفەی کۆمەڵایەتی و ماف و سیاسەتدا دەست رەنگینیی خۆیی و بە پێزیی و بڕشتیی خامەکەی ساخ کردۆتەوە.

لە لایەکی ترەوە رابەرێکی بەرچاو و بەناوبانگی رێبازی کاتۆلیکییە و لە سیاسەتدا لایەنگیری سیستەمی دەرەبەگایەتی (فیودالیزم)ی سەردەمی خۆی بووە، لە دواییدا بووە بە رابەرێکی گرووپی دۆمێنیکان کە لە سەردەمی خۆیدا بڵاو و دەستبەکاربووە. تەریقەتی دۆمێنیك لایەنگیرانی کڵێسەی هانداوە دەستبەرداری ماڵی دنیا بێن و بەدەروازە و سواڵ و زەکات و سەرفترە ژیان بەسەر بەرن. لە فەلسەفەکەیدا ئەگەرچی لایەنگیری ئەرستۆ بووە، بەڵام لە کتێبی ((یەکڕەنگیی ژیردا)) بە توندی دژی بۆچوونەکانی ئبن روشدی لاتینی و فەلسەفە یۆنانی لەسەر فەلسەفە و بڕوای ئایینی کڵێسەی مەسیحی سەردەمی خۆی کردۆتەوە. رەخنەکانی راستەوخۆ ئاراستەی جیهاندی سیگەر برابانتی رابەری رێبازی ئبن روشدی لاتینی کردووە. کەچی هەندێك لە بۆچوونەکانی خۆیشی ساڵی (1277ز) لەو لیستەدا هاتوون[1] کەشیش تێمپێ کەشیشی پاریس بەفەرمانی پاپ دژی فەیلەسووفان دەریکردووە و هەندێك بابەتی فەلسەفەی پێ قەدەخە

[1] Hans, Ulrich Wöhler., Geschi chte der mittelalterlichen Philosophie. VEB. Berlin 1990. s. 110.

کردووە. لەو لیستەیدا (219) تێزەی لاهووتی و فەلسەفەیی هزرمەندانی ئەو دوو بوارە وەك بابەتی گومڕایی دانراون و ڕێگا نەدراوە هیچی تر لە زانکۆی پاریس – کۆلیجی هونەرەکان بگوترێنەوە.

ئەگەر فەلسەفە لەلای توماسی ئەکوینی کایە و دەڤەر و پاوانی تایبەتی بە خۆی — ئەرك و فەرمان و میتۆدە — ی هەبوو بێ لە هی لاهوت جیاواز بووبن، بەڵام لە نووسین و بڵاوکردنەوە و وتارەکانیدا وا دەرکەوتووە کە فەلسەفەی بە خزمەتچی لاهوت و کاروباری تیۆری دوگمەکانی ئایین داناوە. دوای بێنە و بەرە و بگرە و بەردەیەکی فرە و زۆر و زەبەندە لە ڕێ و ڕەسمێکی پڕشکۆی ئایینیدا پاپی مەزن Papist لە ساڵی (1323ز)دا توماسی ئەکوینی بە توماسی ئەکوینی — پیاوچاك و پیرۆز — ناوزە دەکردووە.

ئەگەرچی لە کۆڕ و کۆمەڵە فەلسەفەییەکاندا ئەو وێنە لە مێشکدا ڕەخساوە توماسی ئەکوینی داهێنەرانە و بە شێوازێکی سیستەمییانە فەلسەفەی لەگەڵ بڕوا و ئایینی مەسیحی ئاوێتەی یەکتری کردووە و یەکەیەکی ڕێکوپێکی لێیان پێکهێناوە بەبێ ئەوەی هیچیان لەوی دیکەیاندا توابێتەوە یان دەستبەرداری کەسێتیی خۆی ببێ، ئەوا لە بواری تریشدا ئەوپەڕی دەست ڕەنگینی نواندنەوە بە تایبەتی:

- پرۆسەی زانین.
- بوونی ڕەب و ئەو بەڵگانەی ئەو بوونە پشتڕاست دەکەنەوە.
- داهێنانی جیهان و بوون و میتافیزیك.
- مرۆڤ، نەفس، گیان و دەروون.



- ئاکار و ئازادیی خواست.
- قانوونەکان بە گشتی...تاد.
- چەند بابەتی تری هەمەڕەنگ کە لە چوارچێوەی ئەم بابەتەدا باسیان دەکەین و ئاماژەیان پێ دەدەن.

## پرۆسەی زانین

لە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەوەندەی پەیوەندی بە فەلسەفەی مەسیحییەوە هەیە، ئەو بیرۆکەیە وەك بنەڕەتێکی گومان هەڵنەگر پشتی پێ بەستراوە:

- جیاکردنەوەی نەفس لە لەش.
- جیاکردنەوەی زانینی ژیرەکی لە زانینی هەستەکی.

ئەو جیاکردنەوە و هەڵاواردنە هەنگاوێك بووە بنەمای ئایدیالیستی فەلسەفەکە و ئایینەکە هاویشتنەکەیان کردووە بە ناچارەکی. لە چوارچێوەی ئەو دوو ڕەنگییەدا لایەنێك کراوە بە بنەما و ئەوی تر بووە بە لق و پاشکۆ.

نەفس نەمرە و لەش ساتەکییەو نامێنێ و لە ناودەچێ، ئەو زانینەی بەڕێگای هەستەکانی لەشەوە دەستگیر دەبێ جێگای گومانە و دڵنیایی لێ ناکرێ، کەچی ئەو زانینەی پەیوەستە بە ژیرەوە ڕاست و دروستە و هیچ بوارێکی ئەگەر و گومان نادات.

هەر لە سەردەمی ئۆگۆستینەوە (354- 430ز) گومان لەو زانینە کراوە، کە بە هۆی هەستەکانەوە دەکەوێتەوە، رەوشەکە بەو بیانوەوە روونکراوەتەوە گوایە هەموو ئەو شتانەی بە هۆی هەستەکانی لەشەوە بەدەست دەهێنرێن بێ پسانەوە دەگۆڕێ، ئەو شتەش کە بگۆڕێن و لە رەوشێکدا بەردەوام نەبێت ناکرێ پەی پێ بربێت[1]. ئەو زانینەی بە هۆی هەستەوە دەستگیر دەبێ ناکرێ بەسادە و ساکار و ئاسانی لەوە جیابکرێتەوە کە هەڵەیە و لە ئەندێشەوە کەوتۆتەوە، بۆیە ناکرێ چاوەڕێی راستی لە هەستەکان بکرێت. لە لایەکی ترەوە هەر بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونە، لە فەلسەفەی مەسیحیدا وا دانراوە کە جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان گیان (نەفس) و لەشدا هەیە ئەو جۆرە پەیوەندییە لە شێوەی کار و کار لە یەکتری کردندا بەرجەستە دەبێ. بەڵام بە پێی پلەوپایەی هەریەکەیان ئەو کار و کار لە یەکتری کردنە دیار و دەستنیشان دەکرێ و بەدەر دەکەوێ کام لایە کار لەوی تریان دەکات و کامە کاری تێدەکرێ.

لە سەردەمی ئەفلاتوونەوە و بگرە پێشتریش وا دانراوە کە نەفس (گیان) پلەوپایەی لە هی لەشی بڵند و بەرزترە. بۆیە ناکرێ مرۆڤ وای بۆ بچێ کە لەش کار لە گیان (نەفس) دەکات، چونکە ئەوی کاریگەر بێ و کارلێکردن بکات لەسەر و ئەوەوەیە کە کاری

(1) Eugen Rolfes und Karl Bormann.(Hrsg): Die Philosophie Des Thomas Von Aquin. Felix Meiner verlag . Hamburg 1977. s. 20. ff.



تێدەکرێ و پایەکەی بەرزترە. لەم بڕیارەوە ئەو ئەنجامە دەکەوێتەوە کە وێنەی لەش و لەشیی و لەشەکان لە گیاندا لەش نایڕەخسێنێ، بەڵکو گیان خۆی لە خۆیدا دەینەخشێنێ. ئینجا چالاکیی کارلێکردنە کە بە هیچ جۆرێك لە هێز و توانای هۆکارەکەی بەولاوە پتر کار ناکات. لەم کەش و هەوا لاهوتییەدا توماسی ئەکوینی چالاك و دەستبەکار بووە.

ئەگەرچی لە بنەڕەتدا توماسی ئەکوینی بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئۆگۆستین نەبووە ئەوەندەی بابەتەکە پەیوەندی بە پرۆسەی زانینەوە هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆشاوە کەسایەتی خۆی و جێدەستی خامە رەنگینەکەی بەرجەستە بکات. بۆیە لە هەندێك لادا جۆرە لادانێك لە رەوتی ئۆگۆستینی ئەکوینی هەست پێدەکرێت.

بەلای توماسی ئەکوینییەوە مرۆڤ توانای زانینی هەیە، خۆ ئەگەر رۆژانە بەدەیان هەڵە بکات ئەوا بەهۆی سەرنجدان و وردبوونەوەیەکی رێکوپێك دەتوانێ ئەو هەڵانەی ئاشکرا بکات و پەردەیان لەسەر لابدات.

لەمەوە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤ راستە لە پرۆسەی زانین و شتزانینیدا لە هەموو دەڤەرەکاندا ئەوپەڕی فراوان و بێ سنوور بڕ ناکات، بەڵام ئەو زانینەی دەستگیر دەبێ پێداویستییە گرنگەکانی ژیانی دابین دەکەن و بگرە ئەوەندەیە کە پێداویستییەکانی ژیانی پێویستیان پێیەتی. راستە جەوهەر و ژیری مرۆڤ و توانای زانینەکەی سنووردارن و بێ کوتایی بڕ ناکەن، بەڵام رەب Gott بە تەواوی و

ئەوەندەی پێویست بکات هێزی فام و تێگەیشتنی بە داهێنراوەکانی بەخشیوە بۆ ئەوەی توانای ئەوەیان هەبێ لە ژین و جیهاندا سەرەودەرکەن. بەلای ئەکوینییەوە زانین بریتییە لە پرۆسەیەکی چڕ و ئالۆز کە بە چەند هەنگاودا تێئەپەڕێ و لە چەند لایەنێك پێکدێت:

**یەکەم** – هەستکردن و تێبینیکردن بە هۆی هەستەکانەوە( Sinneswahrnehmung ) ئەم توانای هەستەکییەی پەی بردن و شتزانینە سەرەتا و دەستپێکی پرۆسەی شتزانینە.[1] دەرفەت و توانای چالاکییەکی گیانی بۆ مرۆڤ دابین دەکات. ئەم پرۆسەیە ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەکرێ بە هەستەکان پەیان پێ ببردرێ. لەو پەیبردنە هەستەکییەدا دەستپێکی دارشتنی چەمکە گشتییەکان دەرەخسێ. چەمکی گشتی رەخساندن لە پرۆسەی ئەبستراکت کردن بەولاوە شتێکی دیکە نییە. هەروەها لەو قۆناغەی یەکەمی زانیندا، دەکرێ بە قۆناغی بنەڕەتی دابنرێ، هەروەك توماسی ئەکوینی بۆی چووە، شتە زانراوەکان بەراورد دەکرێن، لە یەکتری چووەکان و جیاوازەکان دیار و دەستنیشان دەکرێن.

ئەکوینی وتویەتی، مرۆڤ دەبێژێ، دانا مرۆڤە هەروەها دەڵێ تواناش مرۆڤە، ئینجا لە خۆی دەپرسێ چۆن توانیم بڵێم ئەوان هەردووکیان مرۆڤن؟ لە وەڵامدا دەوترێ، کاتێك سەرنجی هەردووکیان

[1] Franz Schupp., Geschichte der Philosophie im überblik . Bd. 2. Meiner 2003.S. 38q ff.



دراوە لەیەکچوونێك هەست پێکراوە، بۆیە هەردووکیان بە مرۆڤ ناوبراون ئەو لەکچوونە دەبێتە مایەی کەوتنەوەی وێنەیەکی هەمەکی گشتی کە دەکرێ بە چەمکیش ناوبرێ، چەمکی مرۆڤیی.

**دووەم:** فام و تێگەیشتن[1] جگە لە چالاکی زانینی هەستەکی مرۆڤ توانایەکی تری هەیە، کە قۆناغی دووەمی پرۆسەی زانینی لێپێکدێت، توانای تێگەیشتن Verstand، ئەم توانایە کاتێك بابەتەکە پەیوەندی بە راستیی و راستەقینەی زانینەوە هەبێ، بەو فۆرم و روخسارانە بەدەردەکەوێ: وا زانین ( مەزەندەکردن ) یان ئەگەر و گومانکردن.

مرۆڤ دەربارەی ئەو شتانەی دەیانزانێ وێنەیەك لە مێشکیدا دەنەخشێ یاخود بابەتەکان وێنا دەکات. ئەم وێنەیە بە بەرستەیەکی دیاریکراوی زمان دەردەبڕێ. لە نێوان وێنە و رستە دەربڕەکەدا جۆرە هەماهەنگییەك دەبێ هەبێ ئەگەر بتوانرێ رستەکە دەربڕی راستەقینەی وێنەکە دابنرێت. ئەگەر ئەو هەماهەنگییە و ئەو تەباییەی نێوان هەردووك لایەن لە لایەن فام و تێگەیشتنەوە پشت راست کرایەوە بەوەی کە پێکهاتەی نێو وێنەکە لەگەڵ بەشەکانی رستەکە هەماهەنگییەك کە هەستی پێدەکرێت بەرجەستە دەکەن، رستەکە بە دەربڕی راستیی دادەنرێت . بەم پێیە وەك ئەکوینی بۆی چووە لە پرۆسەی زانیندا مرۆڤ ئەو توانایەی هەیە[2] کە بە هۆی

[1] Franz Schupp., Ebenda S. 391.

[2] Franz Schupp., Ebenda S. 390.

زمانەوە وێنەیەكی هەڵكەوتی راستەقینە بنەخشێنێ و بە هۆی فام و تێگەیشتنەوە هەماهەنگیی و تەبایی نێوان رستەی زمانی دەربڕ و وێنەی هەڵكەوتی راستەقینە هەڵبسەنگێنێ و بڕیاری لەبارەیەوە بدات. پەسەندكردنی ئەم تەبایی و هەماهەنگییە ئەوەی لێدەكەوێتەوە كە رستەكە راستە و راستەقینە دەردەبڕێ.

بەم پێیە پرۆسەی زانین، ئەگەرچی بە هەستەكان دەستپێدەكات و ناكرێ دەستبەرداری فام و تێگەیشتن و ژیر ببێ ئەوا خۆی لە خۆیدا لە سێ لایەن پێكهاتووە:

**یەكەم:** لایەنێك كە خودی مرۆڤە شت زانەكەیە.

**دووەم:** بابەتێك كە لەلایەن مرۆڤەكەوە دەزانرێت.

**سێیەم:** ئینجا چالاكی و كار و پرۆسەی زانینەكە خۆی.

ئەگەر مرۆڤ سەرنجی ئەو بۆ چوونانەی توماسی ئەكوینی بدات بۆی دەردەكەوێ چۆن بە هۆی لەیەكچوون و جیاوازیكردن لە نێوان بابەتەكانەوە چەمكی جەوهەر و رووكەش Akziden دەكەونەوە. ئەو لەیەكچوون و جیاوازییە تایبەتمەندی گەوهەری، كە سروشتی شتەكە پێكدەهێنێ دەستنیشان دەكات و لەوە جیادەكاتەوە كە خەسڵەتێكی لاوەكییە و بە لەدەست دانی گەوهەری شتەكە لە دەست نادرێت.



# میتافیزیک

1- بایەتی میتافزیك لە جیهاندیدی فەلسەفەی توماسی ئەكوینیدا توندوتۆڵ بە لاهووتەكەیەوە بەندە بە جۆرێك هەردووكیان نەك هەر توندوتۆڵ بەیەكەوە بەستراون بگرە تەواوكەری یەكترین.

ئەگەر لەو سەرچاوانە وردبینەوە كە دەربارەی فەلسەفەی مەسیحی سەدەكانی ناوەڕاست نووسراون دەبینین كە هەموویان توماسی ئەكوینی بە میری فەلسەفەی سكولاستی دادەنێن، بە تایبەتی لەو رۆڵەدا كە لە جێگیركردنی پایەی فەلسەفەی ئەرستۆدا لە جیهانی مەسیحی سەردەمی خۆیدا گێڕاویەتی، لەگەڵ ئەو جیهاندیدە سەرتاپاگیرە لاهووتییەی بە بنەماكانی فەلسەفەی پیادەڕەوەكان (لایەنگیرانی ئەرستۆ) پشت ئەستوور بووە و رەنگی رشتووە.

لەو جیهاندیدە بە پێز و فراوانە و سەرتاپاگیرەی توماسی ئەكوینیدا دوو میتۆدەی بنەڕەتی لاهووتی سكولاستی سەرنج رادەكێشن:

**یەكەم:** میتۆدی دیالێكتیكی، بە واتای ئەو سەردەمە، ئەو میتۆدە پشتی بەو بەڵگانە بەستووە كە لە كتێبی مزگێنی ((ئینجیلی)) مەسیحیدا هاتوون،[1] بۆ ساغكردنەوەی ناوەڕۆك و ئامانجەكانی ئەو لاهووتەی ئەكوینی رەنگی رشتووە. لەم دەقەر و كایەیەدا دەسەڵاتی فەلسەفەیی ژێر وەك بنەمایەكی یارمەتیدەری

(1) Maurice De Wulf., Geschichte der mittelaterlichen Philosophie. Tübingen 1913. s. 294.

لاوەکی بۆ پشت راستکردنەوەی بنەڕەتەکانی لاهووت بەکار هاتووە. هەر لێرەوە دەردەکەوێ چۆن ئەکوینی فەلسەفەی بە قەرەواش و خزمەتچی لاهووت داناوە.

**دووەم:** لە سۆنگەی ئەو میتۆدەیەوە کۆشاوە بەهۆی فەلسەفە بە گشتی و بە هۆی فەلسەفەی پیادەڕەوەکانەوە داکۆکی لە دۆگمەکانی ئایینەکەی بکات. بە پێی ئەم بەیەکەوە بەستنەوەی توندوتۆڵی بنەما و بنەڕەتەکانی ژێر بە بنەما سەرەکییەکانی بڕوا و ئیمانەوە لاهووت کارەکتەر و خەسڵەتێکی سەرنج دان و وردبوونەوەی ژیرەکی Rational پێبڕاوە.

بابەتی زانست بەوە لە لاهووت جیا دەکرێتەوە کە لە چاو لاهووت و میتافیزیك شێواز و جۆری تایبەتی خۆی شت زانینی هەیە، بۆیە لێرەدا ئەو بابەتەی دەزانرێ رۆڵێکی ئەوتۆ ناگێڕێ. راستە لاهووت و فەلسەفە هاوکاری و کۆمەکی یەکتری دەکەن و دووەمیان بە پلە لە دوایی یەکەمیانەوە دێت، بەڵام ئەوی بە تەواوەتی تایبەتمەندی هەر یەکێکیان پشتڕاست دەکاتەوە ئەو روانگە و سۆنگەیەیە کە لێیەوە سەرنجی بابەتەکان دەدەن.

مرۆڤ بەوە ناسراوە توانای ئەبستراکتکردنی هەیە، ئەبستراکت پرۆسەیەکە تەنیا هەر لە مێشکدا دەقەومێ تێیدا وێنە و روخسار لە کەرەسە و بابەت (مادده) جیا دەکرێتەوە. بۆ نموونە بە هۆی ئەبستراکتکردنەوە مرۆڤ وێنەی ئەم و ئەو، هی ئەسپ، چیا، درەختی



لە مێشکدایە. لێرەوە لەبەرئەوەی مرۆڤ بە هەستەکان شت دەزانێ ئەم شێواز و رێگای هەستەکییە تواناکەی سنووردارە و هەتا سەر بڕ ناکات، بۆیە بۆ زانینی بابەتی بەدەر لە کەرەسە و مادده و کەرەسەی سەرو سروشتی ناچارە پەنا بەرێتە بەر هێز و توانای ئەبستراکتکردن.

2- لە میتافیزیکی توماسی ئەکوینیدا هزر و جیهاندیدە بە بڕشت و بە پێزەکەی بە دەردەکەوێ. هەر لەو بابەتەدا جێدەستی ئەرستۆ لە چەمکەکانەوە تاوەکو کێشە و بنەما بنەڕەتییەکانی فەلسەفەکەی شان بە شانی بیربۆچوونەکانی ئۆگۆستین و ئەفلاتوونیزمی نوی، کە ئاوێتەی یەکتری بوون و تانوپۆی بابەتی میتافیزیکەکەی پێکدەهێنن، هەستی پێدەکرێت.

گەوهەر تەنیا بیرۆکە نییە، بەڵکو ئەوەیە کە لە روخسار و کەرەسە (مادده) پێکهاتووە، بوونیش لە خۆیدا ئەو بابەتەیە کە میتافیزیك وەك زانست (بە پێی واتای ئەو سەردەمە) لێوەی دەکۆڵێتەوە، بەڵام هەڵکەوت و راستەقینە ئەوەیە کە لە کات و شوێنی راستەقینەوە نزیك بێت[1]. ئەو بڕیارە لەوە کەم ناکاتەوە کە توماسی ئەکوینی داکۆکی لێکردووە گوایە گەوهەرکان لە فۆرم و بیرۆکە پێکهاتوون و بە هۆیانەوە و لێیانەوە رەب بوون و بوونەوەری داهێناوە، هەر لێیانەوە داهێنان و پەیدابوون کەوتوونەتەوە، لێرەوە

---

(1) Johannes Hirschberger., Geschichte der Philosophie. Bd. I. Altertum und Mittelalter. Komet . 1980 . s. 476.

میتافیزیك و لاهووت ئاوێتەی یەكتری دەبن. بوون بە بوونی هەستپێكردن و هۆشەوە بەندە، چونكە بابەتی زانین لە دوا قۆناغدا جۆرە دانان و پێكهاتەیەك گیان (ڕۆح) دەیكات و دەشكرێ وا دابنرێت كە بابەتەكانیش لە لایەكی دیكەوە سروشتی گیان دیار و دەستنیشان دەكەن.

بوون و ئەو سروشت و تایبەتمەندییانەی پێیدەبڕێن بابەتێكن قەدەغە و پاوانی میتافیزیكین بۆیە لە میتافیزیكی توماسی ئەكوینیدا ئەو لایەن و كەرەسانە تاوتوێ كراون:

بوون داهێنراو، بەشداربوون لە بوون و ئایدیادا، چەمكەكان، لەیەكچوون و جیاوازیی، ترانسندێنتال، پلەكانی بوون، ڕێتێچوون... تاد. ئەگەرچی دەكرێ ئەم وشە و بابەتانە بە پشكێكی سەرەكی زانستی بوون (ئۆنتلۆجی) دابنرێن، بەڵام لەبەرئەوەی توماسی ئەكوینی لە سۆنگەیەكی لاهووتی ئایینییەوە بنەمای فەلسەفەكەی داناوە و سوودی لە زۆر سەرچاوەی جیاوازەوە كە ئەو كاتە لە ئارادا بوون و لە سەردەمی پێشووتر ماونەتەوە، وەرگرتووە دەكرێ بە بەشێكی میتافیزیكەكەی ئەو رابەرەی كلێسەی مەسیحی دابنرێن كە خۆی راستە سەر بە ئەرستۆ بووە، بەڵام لەزۆر بابەتدا گەڕاوەتەوە سەر تەورات و ئینجیل و ئەفلاتوون و ئۆگۆستینی ئەكوینی. بۆ نموونە كاتێك باسی بوون و راستیی دەكات وای بۆ دەچێ كە بوون وەك چەمكێكی دەربڕین دەكرێ بۆ ڕەب بۆ داهێنراوەكانی و بۆ گەوهەر و



خەسڵەت و تایبەتمەندییەكان بەكاربهێنرێت، بە هەمان شێواز لەو باوەڕەدایە كە راستیی فەلسەفە دژ و پێچەوانەی ئەو راستییە نییە كە بە هۆی سروش (وەحی) و ئایینەوە هاتووە، چونكە راستیی یەك و یەك شتە. لەلایەكی ترەوە ئەگەر بڕوا و ئیمان پشت بە زانینی سروشتی ببەستێ و وەك هەلومەرج لێوەی هەنگاو بنێ ئەوا بەهرەی ڕەببانی پشت بە سروشت دەبەستێ.[1]

بابەتی بوونەوەری بەرز (ڕەب) ڕۆڵێكی سەرەكی لە فەلسەفەی میتافیزیكی توماسی ئەكوینیدا گێڕاوە. لەبەرئەوەی توانای بڕكردنی زانینی هەستەكی و ئەزموون و شارەزایی سنووردارە بۆ ناسین و زانینی ڕەب دەبێ بە هۆی بڕوا و ئیمانەوە پشت بەو شتانە ببەسترێ كە بە سروش (وەحی) هاتوون و لە تەورات و ئینجیلدا نووسراون و تۆماركراون. بۆ نموونە هیچ فەیلەسووفێك ناتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە ئایا جیهان سەرەتا و دەسپێكی هەیە یان نا؟

سەرچاوەكان توماسی ئەكوینی دەخەنە خانەی ڕێئالیستەكانەوە، چونكە ئەكوینی ((بوونی راستەقینەی جیهانی دەوروبەری سەربەخۆ لە مرۆڤ بە هەلومەرجی بوونی فۆرمە جەوهەرییە هەمەكییە گشتییەكان)) داناوە.[2] راستە ئەكوینی

(1) Wolfgang Röd., Der weg der Philosophie. Bd. I. München . 1994. s. 345 ff.

(2) Wolfgang Röd., Ebenda. S.348.

گومانی لە جیهانی دەوروبەر نەکردووە و بوونی ئەو جیهانەی پابەندیی زانین و بڕیار و حوکمدانی مرۆڤ نەکردووە، بەڵام ئەو جیهاندیدەی توماسی ئەکوینی هەرگیز ناکرێ بکرێ بە بەڵگە و رێئالیستی ئەکوینی پێ پشتڕاست بکرێتەوە، چونکە ئەکوینی بە هۆی سەرنجدانی فەلسەفەییانە و پەنابردنە بەر میتۆدەی توێژینەوە و ئەنجامگیری لۆژیکیانە بەو ئەنجامە نەگەیشتووە کە بڵێ ((جیهانبوونی راستەقینەی هەیە و ئەو بوونە پەکی لەسەر بڕیاری فەیلەسووف نەکەوتووە))، بەڵکو بڕوابوون و ئیمان بە تەوراتی موسا کە لە بەشی یەکەمی دا باسی کردووە کە رەبی موسا لە شەش رۆژدا جیهانی داهێناوە،[1] بۆتە مایەی ئەوەی ئەم بڕیارە بدات. لێرەوە بە بۆچوونی من راستتر وابووە بگوترێ ئەکوینی جیهاندیدی ئایینی موسا — مەسیحی بە راست و رەوان داناوە.

## بەڵگەکانی بوونی رەب

فەیلەسووفی بەناوبانگی سەدەی حەڤدە لایبنیتس (1646-1716ز) لەو باوەڕە دابووە کە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست وەك تەونی جاڵجاڵۆکە وابووە ئەوپەڕی وەستایی و وردەکاری و دەست رەنگینی تێدا بەکارهاتووە، بەڵام هەموو کەسێك دەزانێ کە تەونی

[1] تەورات بە ئەڵمانی سفری پەیدابوون: 1–2: 2.



جاڵجاڵۆکە هیچ سوودێکی نییە! ئەگەر ئەو بڕیارە — حوکمە — ی لایبنیتس پشتگوێ بخەین و سوود لە دەربڕینەکەی وەربگرین دەڵێین:

توماسی ئەکوینی ئەوپەڕی وەستایی و وردەکاری و دەست رەنگینی لەو بابەتەدا بەکارهێناوە کە بوونی رەببی پێ ساخ و پشتڕاست کردۆتەوە. لە سەرەتادا هەوڵی داوە تیشك بخاتە سەر ئەو کەلەبەرانەی لە بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی سانت ئەنسلمدا هەستی پێکردوون ئینجا پێنج بەڵگەی بۆ ساخکردنی بوونی رەب خستۆتە بەرچاو. بەڵگەکان ئەمانەن:

**یەکەم:** بوونی بزووتنەوە بوونی رەب وەك یەکەم بزوێنەری ناجووڵاوە ساخ دەکاتەوە.

**دووەم:** نەزم و رێکوپێکی هۆکاری کاریگەربوونی رەب وەك یەکەم هۆکار پشتڕاست دەکاتەوە.

**سێیەم:** بوونی ئەو شتانەی بوونەکەیان رێککەوت و داهێنراون بوونی رەبیان وەك جەوهەرێکی ناچاریی لێدەکەوێتەوە.

**چوارەم:** لە راددەی فرەتر و کەمیی تر بوونی شتە سنوور کۆتاییەکانەوە دەماگەیەنێتە ئەوەی رەببوونی ئەوپەڕی رەهایی بەرزە.

**پێنجەم:** ئامانجەکی سروشت ساخی دەکاتەوە کە رەب خۆی یەکەم بنەمای ئەمانجەکییەتییە.[1]

[1] Wolfgang Röd., Ebenda. S.351.

ئەکوینی لە سەرەتادا بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی سانت ئەنسلمی تاوتوێ کردووە کە بریتییە لەوەی بیرۆکەی بوونی رەب لە مێشکدا بوونی رەب لە هەڵکەوت و دەرەوەی مێشکدا لێدەکەوێتەوە.

بەلای توماسی ئەکوینییەوە ئەگەر بە ئەزموونێکی هزر و بیر بوون لە رەب زەوت بکرێت ئەوا هەر هەست بە بوونی لە رەب دەکرێت. ئەوی لێرەدا هەستی پێدەکرێت، وەك من بۆی بچم و ئەوەندەی لەو بارەیەوە ئاگاردار بم، ئەم قسەیە هی بو عەلی سینایەی بوخارییە! بو عەلی سینا کاتێك ویستوویەتی بوونی سەربەخۆی نەفس شانبەشانی لەش پشتڕاست بکاتەوە هەمان شتی گوتووە. ئەگەر مرۆڤ وای دابنێ کە لەشییان لێ زەوت کردووە ئەوا هەر هەست بە هەبوونی بوونی خۆی دەکات، کە وابوو خود(نەفس) هەیە و لە لەش جیاوازە!. ئەکوینی لە بەرهەمەکانیدا، بەڵام لە بابەتی تردا ناوی بو عەلی سینای هێناوە کە بە (Avicenna) ناوی بردووە.

بەلای ئەکوینییەوە، ناکرێ — بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی ئەنسلم — بکرێ بە بنەما، چونگە بوونی رەب بە هیچ جۆرێك لە چەمکی رووتی بوونەوە ناکەوێتەوە. خۆ ئەگەر بە هۆی بوونی ئەو چەمکەوە لە مێشکدا بڕیاری بوونی رەب لە دەرەوەی مێشك و فامدا بدرێت، ئەوا لێرەدا رەب وەك بوونەوەرێکی لەشی ماددە دادەنرێت و ئەمەش لەگەڵ بوونی رەبدا کە دوورە لە ماددە ناگونجێ.



**بەڵگەی یەکەم: بزووتنەوە**

ئەو بەڵگەیە بەندە بە بوونەوەری جووڵاوە، ئەو جووڵانەوەیە پێویستی بە هۆکارێکە کە هۆ و مایەی ئەو بزووتنەوەیەتی. تەنانەت بە هۆی هەستەکانیشییەوە دەکرێ ساخ بکرێتەوە کە لە جیهاندا شت هەیە دەبزوێ. ئەو بزووتنەوەیەش بەوە لێکدەدرێتەوە کە گوێزرانەوەیە لە شیاوەکییەوە بۆ کردەکی راستەقینە.[1] ئەوی دەبزوێ بە هۆی شتێکی ترەوە دەجووڵێتەوە، چونکە گوێزارانەوە لە شیاوەکییەوە بۆ کردەکییەکی راستەقینە بەبێ بوونەوەرێکی راستەقینە هەبوو نابێ. ئەو زنجیرەیە ناکرێ بەبێ کۆتایی بەردەوام بێت، یەکەم بە هۆی دووەم و دووەم بە هۆی سێیەم ..تاد. بۆیە دەبێ زنجیرەکە بە بزوێنەرێك کۆتایی بێت، کە هۆکاری بزووتنەوەی هەموو ئەوانی تر و خۆی ناجووڵێتەوە. وەك دەرکەوتوو ئەم بەڵگەیە لە کتێبی فیزیکی ئەرستۆوە وەرگیراوە کە لە وێدا ((بەو بزوێنەرەی خۆی نابزوێ)) ناوبراوە.

(1) Wilhelm Weischedel., Der Gott der Philosophen WB Darmstadt. 1998. s.136-137.

– دەمەوێ لێرەدا خوێنەر ئاگادار بکەمەوە کە کە دکتۆر فایشیدیل لە زمانی لاتینییەوە بەڵگەکانی ئەکوینی کردووە بە ئەڵمانی و لە کتێبی ناوبراودا بڵاوی کردوونەتەوە. منیش لە هێنانەوەی ئەو بەڵگانەدا سوودم لە وەرگێڕانە ئەڵمانییەکەی ئەو وەرگرتووە.

**بەڵگەی دووەم: هۆکاری کاریگەر**

مرۆڤ لە توانایدا هەیە کە بە هەستەکانی پەی بەوە بەرێت کە نەزمێکی هۆکاری کارا و کاریگەر هەیە. ناکرێ ئەو هۆکارە کاریگەرە خۆی هۆکاری کاریگەری خۆی بێت، چونکە ئەو کاتە، ئەگەر وابوو، دەبێ ئەوەیان لە خۆی بنەڕەتی تر بێت ئەمەش ناشێ. بەهەمان شێوازی پێشوو ناکرێ و ناگونجێ زنجیرەکە بێ کۆتایی بەردەوام بێت، ئەمەیان لەوی تر و ئەوی تر لەوەی تر.. تاد. دەبێ زنجیرەکە بە ئاڵقەیەك کۆتایی بێت ئەوەیان هۆکاری کاری هەموو ئەوانی ترە و خۆی هۆکاری نییە، ئەمەش ڕەب خۆیەتی. بۆ پتر روونکردنەوە، هۆکاری یەکەم هۆی ئەوی ناوەڕاستە، هۆکاری ناوەڕاستیش هی دواییەکەیە، خۆ ئەگەر مرۆڤ هۆکارەکە لابەرێ ئەوا ئەنجام و کارلێکردنەکە لە ئارادا نامێنێ. هەروەها ئەگەر هۆکاری یەکەم نەبێ هۆکاری ناوەڕاست و دواییش نابێ، بۆیە دەبێ ناچارییانە جۆرە هۆکارێکی کارا و کاریگەری یەکەم هەبێ و وا دابنرێ کە هەیە، کە هەموو کەس بە ڕەب ناوی دەبەن.[1]

**بەڵگەی سێیەم: شیاوەکی و ناچاریی**

لە فەلسەفەی ناوەڕاستی سەردەمی عەباسییەکاندا کە هەندێك بە ئیسلامی و عەرەبەکان بە عەرەبی ناوی دەبەن ئەو دوو چەمکەی شیاوەکیی Möglichen و چەمکی ناچاریی Notwendigen بە دوو چەمکی

(1) W. Weischedel., Ebenda. S. 138.



– الممکن.

– الواجب.

ناوبراوان و لە لای بو عەلی سینا و ئەلفارابی.. تاد.. بەکارهاتوون و من بە دووری نازانم توماسی ئەکوینی لەوانەوە وەریگرتبێ، چونکە ئەو بەرهەمانە کە بە عەرەبی نووسراون ئەو کاتە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی لاتینی و ئەکوینیش لە بەرهەمەکانیدا ناوی ئەو دوو فەیلەسووفە موسڵمانەی هێناوە. بەڵگەی ئەکوینی بەم جۆرەیە:

ئەگەر مرۆڤ لە دەوروبەری خۆی وردبێتەوە لە نێو ئەو شتانەدا کە بەدییان دەکات هی وا هەیە، کە دەکرێ هەبوو ببێ و دەکرێ نەبووبێ، هەندێکی تر هەن پەیدا دەبن و لە ناو دەچن ئەوانەش دەکرێ هەبووبن و نابووبن. ناکرێ ئەو جۆرە شتانە هەمیشە و بەردەوام هەبوو بن. ئەوی نەتوانی هەبوو بێ ناکرێ تاکە جارێك هەبێت. بەڵام ئەگەر هەموو نەکرێ هەبوو بن ئەوا هیچ جارێك شتێك هەبوون نەدەبوو. ئەگەر ئەوە راست بێ ئەوا ئێستاش شتێك دەبوو نەدەبوو. کەوابوو ئەوی هەبوو نییە تەنیا بە هۆی ئەوەوە کە هەیە بوونی خۆی دەستپێدەکات . بۆیە دەبێ بوونەوەرێك هەبێ کە لە خۆیدا ناچارییە[1]. ئەوی ناچارەکی هەبوونە بوونەوەر هۆکارەکەی لە

(1) Böhner, Phil. Und Gilson,E., Christliche Philosophie. Bd. 3. 2. Auflage. Paderborn1954. s.520.

خۆیدایە یاخود هۆکاری هەبوونەکەی لە دەرەوەی خۆیدایە، ئەو زنجیرەیە ناکرێ بێ پسانەوە هەتا هەتایە بەردەوام بێ، بۆیە دەبێ زنجیرەکە بە بوونێك کۆتایی بێت، کە لە خۆیدا بوونەکەی ناچارەکییە. بە واتایەکی روونتر: لە سروشتدا بوونەوەر، شت هەن پەیدا دەبن و لەناودەچن ئینجا دوای بوونەکەیان بوون و نابوونیان دەشێ و شیاوەکییە خۆ ئەگەر نابوون لە هەموو شتێکدا شیاوەکی بووبایە ئەوا دەبوو جارێك هیچ شتێك هەبوو نەبووبایە، ئەگەر ئەم بۆچوون و بڕیارە راست بێ دەبوو ئێستا شتێك لە ئارادا نەبووبایە کەوابوو دەبێ بوونەوەرێکی ناچاریی لە خۆیدا هەبێ ئەمەش لە رەب خۆی بەولاوە نییە[1].

## بەڵگەی چوارەم: جیاوازی پلە و پایە و خەسڵەتی بوونەوەران

Gradualität:

ئەم بەڵگەیە بە ((پلەوپایەکانی بوون))یش ناودەبرێت. لێرەدا توماسی ئەکوینی پەنا دەباتە بەر ئەزموون و شارەزایی ئەو پلەوپایە جیاوازانەی لە نێو شتەکاندا دەبینرێن. مرۆڤ لە نێو شتەکاندا بۆی دەردەکەوێ و ساخ دەبێتەوە کە فرەتر یاخود کەمتر چاکە و راست و رەسەن پایە بەرز هەیە. فرەتر یان کەمتر دەربارەی شتە جیاوازەکان دەگوترێ ئەگەر هاتوو ئەو شتە جیاوازانە بە شێوازی جیاواز خۆیان لەوە نزیك کردەوە کە

(1) بڕوانە، کتێبە بە نرخەکەی مامۆستای نەمر:
– یوسف کرم: تأريخ الفلسفة الاوروبية في العصر الوسيط، دار المعارف بمصر، مكتبة الدراسات الفلسفية، 1957، ص150، لە زۆر شوێنی تردا.



ئەوپەڕی پلەوپایە بڵند و بەرزە.... ئیتر بوونەوەری وا هەیە، کە ئەوپەڕی راستە، ئەوپەڕی چاکەی بەرزە، ئەوپەڕی رەسەنە و ئینجا وەك ئەنجام بوونەوەرێکی پلەوپایە بەرزە. بەم پێیە، وەك بنەمایەکی هۆیەکییانە، هەر رەگەزێك و جۆرێك بەو بوونەوەرە پایەبەرزە ناوبرا هۆکاری هەموو ئەوانەیە کە سەر بەو جۆر و رەگەز و گەوهەرەن... کەوابوو شتێك هەیە، کە هۆکاری بوونی هەموو بوونەوەرەکانە کە ئەوپەڕی چاکەکاریی و کامڵیی و تەواوەتییە ئێمە ئەوە بە رەب ناودەبەین[1]. هەروەها لە نێو شتەکاندا کە مرۆڤ هەست بە بوونیان دەکات و دەیانزانێ و پەیان پێدەبات بۆی دەردەکەوێ کە جۆرە پلەوپایەك هەیە جیاوازی لە نێوانیاندا دەخاتەوە، بۆ نموونە شت هەیە لە شتێکی تر چاکتر و باشترە، بەڵام ئەو چاکە و باشییە رێژەییە کاتێك هەبوو دەبێ کە لە ئەوپەڕی چاکەی بێ سنوور و رەهادا بەشداری بکات کەوابوو دەبێ چاکەی رەهای هەبێ، چاکەی رەهایە راستەقینەی رەهایە و ئەو راستەقینە رەهایە بوونی رەها پێویست دەکات ئەو بوونە رەهایە لە خۆیدا رەببە.[2]

## بەڵگەی پێنجەم: بەڵگەی نەزم و ئامانجەکی

پشت ئەستوور بە تاقیکردنەوە و ئەزموون دەردەکەوێ هەندێك شت هەن زانین و شارەزاییان نییە، بەتایبەتی لەشە سروشتییەکان، کەچی سەرگەرمی گەیشتنە ئەنجامێکن، دەریش دەکەوێ بۆ مەبەستێك بە یەك

(1) W. Weischedel., Ebenda. S. 138.

(2) عبدالرحمن بدوی، فلسفة العصور الوسطى، القاهرة، 1962، ص 151 فما بعد.

شێواز چوست و چالاكن مەبەستەكەش ئەوەیە((باشترین و چاكترین)) دەستگیر و بەدی بهێنن. لەمەوە دەردەكەوێ كە شتێكی رێككەوت نییە، كە بەو ئامانجە بگەن، بەڵكو شتێكە مەبەستێكی لە پشتەوەیە. بەڵام ئەوەی شارەزا و زانینی نەبێ ناتوانێ لەخۆیەوە و بۆ خۆی سەرگەرمی ئامانجێك بێت و هەوڵی بۆ بدات ئەگەر لەلایەن شت زان و شارەزاییەوە رابەرێتی نەكرێت.... كەوابوو ژیریك، شت زان و شارەزاییەك هەیە لەشە سروشتییەكان رابەرێتی دەكات و بەرەو ئامانج دەیانبات ئەو ژیرە بە رەب ناودەبرێت[1].

ئەگەر مرۆڤ لەو پێنج بەڵگانە كە بوونی رەبیان پێ ساخ كراوەتەوە وردبێتەوە ئەو راستییەی بۆ پشتڕاست دەبێتەوە كە توماسی ئەكوینی لە هەردوو كایە و بواری لاهووت و فەلسەفەی یۆنان و سەردەمی خۆیدا چەند شارەزا و دەست رۆیشتوو بووە، خۆ ئەگەر بەوپەڕی تواناوە سوودی لە ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ئەفلاتونیزمی نوێ و سانت ئۆگۆستین وەرگرتبێ بە هیچ شێوازێكیش بنەما ئایینەكەی تەوراتی موسا و ئینجیلی چوار پەیامبەرەكەی مەسیحیەت لەبەرچاو و لە ناخ و مێشك و دەروونندا ون و بزر نەبوون.

خۆ ئەگەر لە بەڵگەكانیدا لە شتی بەرهەستی جیهانی دەوروبەرەوە دەستی پێ كردبێ[2]. و ئەو بوونەی كردبێ بە بنەما لە

(1) Weischedel. W., Ebenda. S. 139.

(2) عبدالرحمن بدوی، المصدر السابق، ص153.



لایەك هەڵوێستی لاهووتی لەیاد نەچووە كە ئەو بوونە بە هەڵكەوتێكی گومانهەڵنەگری داهێنراوی رەب دابنێ لە لایەكی ترەوە فەلسەفەكە هاتۆتە كایەوە كە بنەمای هۆكار و ئامانجەكی لێوە خواستۆتەوە.

بابەتی بەردەوامی هەتاهەتایی زنجیرە ناگونجێ كە ئەكوینی پشتی پێ بەستووە ئەگەر لە فەلسەفەی مامۆستای یەكەمەوە وەرگیرابێ بەوە بنەمایەكەی جێگیر تر كراوە، هەر شتێك دەستپێكی نەبێ ناوەڕاست و كۆتاییشی نابێ! بە پێچەوانەوە ئەوەی دەستپێكی هەبێ هەردوو لایەنەكەی دیكەشی دەبێ. ئەگەرنا بوونی راستەقینەی شت، مرۆڤ و جیهانی دەوروبەر رەوایی و هەڵكەوتی خۆی لە دەست دەدات.

توماسی ئەكوینی وەك رابەرێكی تەریقەتی دۆمینیكی ئایینی مەسیحی ئەوپەڕی بە تەنگەوە بووە بنەماكانی لاهووت پتەو جێگیر بكات بە تایبەتی: سەلماندنی بوونی رەب وەك گەوهەرێكی ترانسندێنتی سەرو سروشت[1]، كە یەكەم بزوێنەری هۆكاری كاریگەر و ناچارەكییە، ئەوپەڕی راست و راستەقینەی بەرزە، لە رادەبەدەر چاكەكار و بوونەوەری پایەبەرزە و ژیرە.

بەڵام ئەوەی لێرەدا بە بیرو هزر دا دێت ئەوەیە، هەموو ئەو شتانەی توماسی ئەكوینی بە خامە رەنگینەكەی تۆماری كردوون بە

(1) Weischedel. W., Ebenda. S. 141.

زمانی ئاسایی مرۆڤی ئەم جیهان و سەرزەمینە وتراون و بەجۆرێك ئەو بوونەوەرە ترانسندێنتە وێناکراوە هەروەك ئەوەی بوونەوەرێکی سروشتی ئەم جیهانە بێت. باشە ئەگەر مرۆڤ تەنیا بۆ ساتێك گریمانەیەك بە هزریدا بێت و بێژێ، هیچ پێویست بەوە ناکات مرۆڤ بوونی ئەو رەببەی توماسی مەسیحی گریمانە بکات و دەتوانێ بەبێ پەنا بردنە بە سەرو سروشت وای دابنێ کە: ئەوەی لەم دنیایە و جیهان و دەوروبەرەدا بەدەردەکەوێ و دێتە بەرچاو دەکرێ بە بنەمایەکی سروشتییەوە یەکەم دەستگیر بکرێت و بێتە دەست دووەم لێکبدرێتەوە و شرۆڤە بکرێت. هەروەها ئەوی لێرەدا سروشتییە بە زمانەکە خۆشییەوە، دەکرێت ببرێتەوە سەر بنج و بناوانی بنەڕەتێکی سروشتی! ئەوی دڵ بیخوازێ و ئاوات و ئامانجیش بێت دەکرێ ببرێتەوە سەر ئەو سەرچاوەی لێوەی کەوتۆتەوە، ژیر و خواست. کەوابوو چ پێویست دەکات مێشکێکی بە پێزی وەك مێشکی توماسی ئەکوینی ئەم جیهانە پان و بەرین و بە پێزە بخاتە لاوە و روو بکاتە سەرو سروشت؟!

## مرۆڤ و نەفس

چ وەك فەیلەسووف و چ وەك لاهووتیی بابەتی مرۆڤ و نەفس ئەوپەڕی سەرنجی توماسی ئەکوینییان راکێشاوە. وەك بنەمایەکی لاهووت و فەلسەفەی ئەو سەردەمە وا سەرنجی مرۆڤ دراوە کە لە دوو بەشی لە یەکتری جیاواز و پێکەوە بەستراو پێکهاتووە:



- نەفس Self.
- لەش Körper.

ئەکوینی لە سۆنگەی ئایینەکەیەوە وای بۆ چووە، بێگومان لێرە ئەرستۆش لە بیرنەکراوە بەتایبەتی بابەتی روخسار و کەرەسە، مرۆڤ لەشێکی زیندووە. بۆ ساخکردنەوەی بوونی ئەو لەشە زیندووە ئەکوینی وای بۆ دەچێ ئەگەر سەرنج بدرێت دەردەکەوێ چەندین گەوهەری لەشی هەیە، مرۆڤ جەوهەرێکە لەو جەوهەرانە، بەوە لە لەشەکانی تر جیاوازن، بۆخۆیان لە خۆیانەوە دەجووڵێنەوە، دەخۆن و دەخۆنەوە، زاووزێ دەکەن، بەهەستەکان شت دەزانن و هەوڵ و کۆشش دەکەن.[1] جگە لەوەش مرۆڤ رەوشێکی تایبەتی خۆی هەیە، لەچاو زیندەوەرەکانی دیکە، بیردەکاتەوە، زیندووە بەهرەی ژیریی و خواستی ئازادی هەیە.

بۆیە دەوترێ مرۆڤ لە لایەنێکی گیانیی کە نەفسە (بەپێی چالاکییەکانییەوە) و لەلایەکی تر کە لەشە پێکهاتووە. ئەم پێکهاتەیە وا دەکات مرۆڤ لەو باوەڕە دابێ کە مرۆڤ لە پلەیەکی ناوەڕاستی نێوان فریشتە و زیندەوەرەکاندایە لەوەدا کە گیان نەفسە لە تایبەتمەندییەکانی پلەی سەرووی بەرزو بەوەی لەشە لە تایبەتمەندییەکانی پلەوپایەی ژێرەوە بەشداری دەکات.[2] بەم پێیە لە

(1) Johannes Hirschberger., Geschichte der Philosophie. Bd. I. Altertum und Mittelalter. Komet . 1980 . s. 507.

(2) یوسف كرم، المصدر السابق نفسه، ص161.

لایەنی گیانی (نەفس) مرۆڤ لایەنێکە لە ماددەوە دوورە و بەلەناوچوونی لەش و تێکچوونی هیچی بەسەر نایەت و لەناو ناچێ، نەفس گیانییە و نەمرە و سەرچاوەی زیندوویەتییە، چونکە ناکرێ بنەما زیندوویی لەش بێ دەبێ کار و کردار و وێنە و روخساری لەش بێت. نەفس لەش نییە، بەڵکو روخسار و فۆرمی بێگەردە بەبێ کەرەسە و ماددە، گیانێکی رووتی بێ خەوشە و جەوهەرێکە بە هیچ جۆرێك پابەندی ماددە نییە و پەکی لەسەری نەکەوتووە.

مرۆڤ لە ژیانیدا تامەزرۆی تەمەن درێژیی و نەمرییە ئەم هەستەی تامەزرۆییە شتێکی کاتی و لاوەکی و هەڵەش و نادروست نییە، بۆیە ئەو حەزە دەکرێ بە بەڵگەیەکی نەمریی گەوهەری گیانی نەفس دابنرێت[1]. دەکرێ ئەو بۆچوونە بە پێچەوانەی جیهاندیدی ئبن روشد و لایەنگیرانی دابنرێ کە لەو باوەڕەدابوون تەنیا هەر ژیرێکی سەر و تاکەکەسی هەیە Überindividuell یەکێکە بۆ هەموان و بە هیچ شێوازێك پەیوەندی بە ماددە و کەرەسەوە نییە پێی دەوترێ ژیری کاریگەر و تەنیا خۆی نەمرە.

ئەکوینی لەو باوەڕەدایە کە نەفسی چەند هێز و توانایەکی هەیە و تایبەتمەندیەکەی پشتڕاست دەکەنەوەو لە زیندەوەرەکانی تر جیای دەکەنەوە، هەروەها لەو باوەڕەدایە کە نەفسی ئەکوینی و بەهرەمەند لەو توانایانە بەهرەمەندە:

(1) Hans Joachim Störig., Kleine Weltgeschichte der Philosophie. Stuttgart 1961. s. 295.



**یەکەم:** بزانێ بڕوا و ئیمانی بەچی هەیە؟

**دووەم:** بزانێ بە دوای چیدا دەگەڕێ و سەرگەرمی چییە؟

**سێیەم:** بزانێ چی پێویستە و دەبێ بیکات[1].

وەك مەسیحییەك لە نووسینەکانیدا جگە لەو چاکەکارییانەی لە سەردەمی یۆنانی کۆندا دراونەتە پاڵ نەفس: دانایی، ئازایی و دلێریی، میانڕەویی، و دادپەروەریی، هەرسێ چاکەکارییەکەی Tugend مەسیحی خستۆتە سەر خەسڵەتە چاکەکارییەکانی نەفس:

- بڕوا و ئیمان، خۆشەویستی، هیوا و ئاوات.

## خەسڵەتەکانی ڕەب

لێرەدا مەبەست لەو تایبەتمەندییانەیە کە توماسی ئەکوینی لە سۆنگەی ئایینی مەسیحییەوە دەیانداتە پاڵ رەب، ئەو تایبەتمەندییانە لەلایەکەوە گەوهەر و چییەتی رەب پشتڕاست دەکەنەوە و لەلایەکی ترەوە بنەمایەکی گرنگی ئایینی مەسیحی بە هۆیەوە جێگیر دەکرێت.

خواستی زانینی خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی رەب، کە خۆی بوونەوەرێکی رووتی ژیرەکی بێگەرد و ترانسندێنتیە، پێویستی بە ئامرازێکی تایبەتی هەیە ئەو ئامرازە خۆی لە ژیر بەولاوە نییە، بەڵام لەبەرئەوەی ژیری مرۆڤ لە هەیۆلاو (کەرەسەی دیاری نەکراو) و فۆرم پێکهاتووە ناتوانێ راستەوخۆ پەی بەو جەوهەر و چییەتی Essenz

(1) Hans Joachim Störig., Ebenda. S. 297.

ڕەب بەرێ. ڕێگای لە بار و پۆزەتیڤ و ئارێی زانین و ناسینی تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی ڕەب لە کردن نایەت و بگرە ناگاتە ئەنجام کەوابوو دەبێ پەناببرێتە بەر ڕێگای نالەبار و نێگتیڤ و ناڕێ، لە سەرەتادا بە ڕێگایەکی نالەبار هەموو ئەو خەسڵەتانە نا دەکرێن کە لەگەڵ پلە و پایە و تەواوەتیی ڕەب ناگونجێن وەك:[1]

بزووتنەوە، گۆڕان، کەم و کوریی، فرە پارچەیی و پێکهاتە، کارلێکران، ئینجا لە جیاتی ئەمانە ئەم خەسڵەتانە دەگوترێن:

نەبزووتن، نەگۆڕان، جێگیر، سادە و بێ ڕەنگی..تاد. ئەم ڕێگایە بریتییە لەوەی ئەو خەسڵەتانەی کەم و کوریی نیشان دەدەن بەدەربکیرێن و دووربخرێنەوە ئینجا خەسڵەت ئارێیەکان ناوبهێنرێن ئەمانە شکۆمەندیی و بێگەردی ڕەب دەردەخەن. خۆیان دەکرێن بە دوو بەشەوە:

- ئەو خەسڵەتانەی بەشێکن لە خودی ڕەب خۆی.
- ئەو خەسڵەتانەن کەوا دەردەکەوێ بە پێچەوانەی سادەیی ڕەببەوە بن و بەشێك نەبن لە خودی خۆی.

خەسڵەتەکانی جۆری یەکەم ئاسایی و بێکێشەن و دەکرێ بێ سڵ و پارێز بەکاربهێنرێن، چونکە چەندین خەسڵەت و تایبەتمەنیی جۆراوجۆری خودی ڕەب خوین و نەهیچی لێ کەم دەکەنەوە و نەهیچی دەخەنە سەر. وەك ئەوەی مرۆڤ بڵێ ڕەب چاکەی ڕەهایە، کامڵ و تەواوەتییە، بێ

[1] عبدالرحمن بدوی، المصدر السابق، ص155. هەروەها بڕوانە:
- Böhner, Phil. und Gilson, E. Ebenda. S. 522. ff.



کۆتایی و بێ سنووره هۆکاری هەموو ئەنجامەکانە و نەگۆڕە و هەمیشەیی و بەردەوامە و کار و کارکردنی بێ پسانەوەیە.

جۆری دووەمیان وا پێدەچێ بە پێچەوانەی سادەیی ڕەهای ناچاریی هۆکاری یەکەم بن[1] وەك ژین، زانست، خواست و ئیرادە، توانا، بەهرە، ئەم جۆرە ناو و خەسڵەتانە وا نیشان دەدەن کە چەند هێز و کردارێکن پتڕن لەوەی جەوهەرەکەی بن، بۆیە دەبێ سەرنج بدرێت و مرۆڤ وردبێتەوە تا چەند و چ ڕادەیەك دەلالەتەکەیان ڕەب دەگرێتەوە؟! ئەکوینی لەم ڕەوشەدا پەنای بردۆتە بەر ناکردنی ئەم تایبەتییانە بۆ دوورگرتنی ئەگەر و گومان و ساخکردنەوەی سادەیی خودی ڕەب. بۆ نموونە کە مرۆڤ باسی ژین و زیندوویی ڕەب دەکات مەبەستی ئەوەیە کە بێگیان نییە.. تاد. کە دەوترێ زانست مەبەستی مرۆڤ کامڵی و تەواوەتی خودی ڕەب خۆیەتی و ئەم خەسڵەتە هیچ جۆرە گۆڕان و پترکردنێك لە خودی یەك ڕەنگی و سادەیی ڕەب بەدی ناهێنی.

## خواست و ئازادی ژیر

1- خواستی ئازاد کە لە سەردەمی دەرکەوتنی زانستی کەلامەوە بە کێشەی ((**الارادة الحرة**)) و ((**الجبر و الاختيار**)) ناوبراوە و پەیوەندی توندوتۆڵی بەو پرسیارەوە هەیە، ئایا مرۆڤ لە کرداری

[1] یوسف کرم، المصدر السابق نفسه، ص154. هەروەها بڕوانە:
- اتين جلسون، روح الفلسفة المسيحية في العصر الوسيط. ت: د. إمام عبدالفتاح إمام. مكتبة مدبولي، 1996، ص328.

ژیانی دا ئازادە یاخود هەموو شتێك قەدەرە و چارەنووسە و لە ناوچاوانی نووسراوە؟ ئەگەر مرۆڤ سەرنجی وردبینانە لە پرسیارەکە بدات یەکسەر و دەستبەجێ بۆی دەردەکەوێ کە بابەتەکە پتر روخسارێکی لاهووتیی هەیە و پەیوەستە بە هەلومەرج و رەوشێك تێیدا گۆڕانی سەرتاپاگیر بەسەر پێکهاتەی کۆمەڵگا و ژیانی رۆژانەی مرۆڤدا هاتووە. ئەم کێشەیە وەك پرسیارێك لە چوارچێوەی جیهاندیدێکی ئاینییدا گەڵاڵە بووە کە بەسەر سەرخانی و ژێرخانی کۆمەڵێکدا سەپێنراوە، کە بە تەواوەتی لە رەگ و ریشەوە تانوپۆیەکەی هەڵوەشێنراوەتەوە. بۆیە ئەگەر ئەو بابەتە بخرێتە سەر خوانی باسکردن دەبێ ئەو رەوشەش بەهەند دابنرێ کە تێیدا چەکەرەی کردووە.

بابەتی خواستی ئازاد پێش بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە تەوراتی موسادا باسکراوە، توماسی ئەکوینی کە شارەزایی فەلسەفەی ئەرستۆ بووە ئەو دوو بابەتەی لەبەر دەستدا بووە و هەوڵی داوە وەك مەسیحییەك و لایەنگیرێکی جیهاندیدی مامۆستای یەکەم بابەتەکە تاوتوێ بکات.

کە مرۆڤ باسی خواستی ئازاد دەکات، ئەگەرچی لەو ئازادییە جیایە کە بەواتا سیاسییەکەی باسدەکرێت، سێ لایەن لەبەر چاو دەگیرێ:

- ئازادی.
- زانین و ژیر.
- توانای سەرپشك بوون و هەڵبژاردن.



لە سەرەتادا دەبێ مرۆڤ خواستێکی هەبێ کە بە ئامانج و ئاواتێکی ئاساییەوە پەیوەستە، ئەویش لە بەختەوەری ژیان بەولاوە نییە[1]. ئینجا هیچ خواستێکی هەڵبژاردن بەبێ زانین و ژیر نابێ و لە کردن نایەت، بۆیە سەرنجدانی ژیرەکی ئەو ئامراز و رێگایانەی لەبەردەستدان بۆ گەیشتنە ئەنجامەکە بە پلەی دووەم دێت و لێرە بە دواوە کاری خواستەکە دەستبەکار دەبێ، لە نێو ئەو ئامرازانەی لەبەردەستدان ئامرازێك کە شیاو بێ هەڵدەبژێرێ.

راستە خواست لە ئارەزووەوە نزیکە، بەڵام خواستێك پشت ئەستوور نەبێ بە ژیر و هەڵبژاردنی ئازاد ئەو تایبەتمەندییەی خۆی لە دەست دەدات. نابێ ئەوەش لە یاد بچێ کە خواست پشت بە بڕیاری ژیر دەبەستێ بۆ ئەوەی توانای سەرپشك بوونەکە بەدی بهێنێ ژیریش لەلایەن خۆیەوە کاتێك بڕیارەکە دەدات کە گەیشتە ئەو رادەیەی کە ساتی هەڵبژاردنەکە لە ئارادا دەبێ.

وەك مەسیحییەك توماسی ئەکوینی لەو باوەڕە دابووە کە رەب مرۆڤی داهێناوە و ئازادی پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی بە سەربەستی بە دوا ئاواتی خۆی بگات، لێرەوە مرۆڤ ئازادە — بە بۆچوونی ئەکوینی — کام رێگایە هەڵبژێرێ و بگرێتە بەر و چ بڕیارێك بدات، بە رێگای بەختەوەریی هەتاهەتایی چۆن یەسوعی مەسیح ئامادەی پێداوە یاخود بە رێگای لە رێگالادان و کلۆڵی هەمیشەییدا بڕوات؟!

[1] أتين جلسون، المصدر نفسة، ص 358.

2- توماسی ئەکوینی وای بۆ چووە ئەگەر مرۆڤ باسی خواستی کرد مەبەستی لەو باسکردنە دوا ئامانجی ژیانە کە بەختەوەرییە. گەیشتنیش بەو ئامانجە وا سوک و ئاسان نییە. بەختەوەری لە خۆشەویستییەوە و لە خۆشویستنەوە سەرچاوە دەگرێ، بەرزترین خۆشویستن ئەوەیە مرۆڤ رەببی خۆش بوێ. لێرەوە توماس دەچێتەوە نێو جیهانی فەلسەفەی ئەرستۆ  خواست و ژیر (فام) بەراورد دەکات و ژیر و تێگەیشتنەکە دەخاتە سەروو خواستەوە، ئەگەرچی خواست بەر لە فام و ژیر بە ئامانجە بابەتەکەی دەگات کە خۆشویستنی رەببە. بەڵام ژیر لە شێوازی زانیندا پشت خواست دێت، چونکە خواست توانای کۆششی هەیە و شت بە دەست ناهێنێ، بەڵام ژیر زانین بە دەست دەهێنێ و هەمیشە بە دەستهێنان بە پلە لە پێش کۆششەوەیە.[1] هەر ژیر و خۆی ئەو هێزەیە کە هەڵبژاردنەکەی خواست وەك ئەنجامێك بە ناچاری پەسند دەکات.

پابەندبوونی خواست بە ژیرەوە نابێتە مایەی ئەوەی خواست لە ئازادی هەڵبژاردن بێبەش بێت. ئازادی خواست بابەتێکە بەلای توماسی ئەکوینیەوە گومان هەڵنەگر بووە، خۆ ئەگەر ئەو ئازادییەی خواست نەمێنی ئەوا کرداری مرۆڤ بایەخی پاداشت و سزا و گازندە و

(1) Maurice De Wulf., Geschichte der mittelater;ichen Philosophie. Tübingen 1913. s. 304.



ستایشی لەسەر هەڵدەگیرێ و بابەتی ئاکار و قانوونەکانی هیچ جۆرە رۆڵ و بایەخێکیان نامێنی.

وەك مەسیحیەکی پابەند بە بنەماکانی ئایینەوە، توماس گومانی لەوە نەبووە کە مرۆڤ خواستی ئازادی هەیە لە چەند لایەکەوە:

**یەکەم:** هەڵبژاردن و دەستنیشانکردنی دوا ئامانجی ژیانی.

**دووەم:** هەڵبژاردنی ئەو رێگا و ئامرازەی بەو ئامانجەی دەگەیەنن.

**سێیەم:** ئەو بڕیارەی دەربارەی بابەتەکە دەیدات.

راستە لەم پرۆسەیەدا هەردوو هێزی ژیر و خواست کۆمەکی یەکتری دەکەن، بۆ نموونە ژیر چەند کەرەسە و بابەت دەخاتە بەردەم خواست، خواستیش رەوت و ئاراستەکە بەو نیشان دەدات و تایبەتمەندی پێدەبەخشێ ئینجا خواست کاری هەڵبژاردنەکە دەگرێتە ئەستۆ.

توماس وەك ئایندارێك، وەك خاوەن بڕوا و ئیمان پشتی بەو بنەمایانە بەستووە کە هەردوو کتێبی تەورات و ئینجیل پێوەی بەندن، بۆیە دەکرێ مرۆڤ بڵێ، ئەوی توماس وتوویەتی لە پشتڕاستکردنەوەی دۆگمی ئایینەکەی بەولاوە شتێکی تری نەگوتووە. خۆ ئەگەر یەکێك وەك توماس مەسیحی نەبی بە هیچ جۆرێك ئەو جیهاندیدە پەسند ناکات، کە ئەکوینی رەنگی رشتووە و داکۆکی لێکردووە. خواستی ئازاد بە پاساودان نە پشتڕاستدەکرێتەوە و نە داکۆکی لێدەکرێت. چونکە ئەو بابەتە لە خۆیدا نەزمێکی دۆگمی بڕوا و باوەڕ- کە لافی سەروو سروشتی لێدەدات ورژاندوویەتی و هەر هەڵێك بدرێت بۆ جێگیرکردنی بابەتێك لەو بابەتانە لەوە ناچێتە

دەرەوە کە لە چوارچێوەیەکی رەنگ بۆ رێژراو سەپێنراو و بەسەر ژیانی مرۆڤدا جۆرە سەبووری و خۆشییەك بە مرۆڤ ببەخشرێ، لە کاتێکدا توماس لە کەسانی تر باشتر زانیویەتی ئەو خواستی ئازاد و ئامانجەی هەیەتی لە دڵخۆشکردنێکی دەرونی نێو جیهانێکی تۆبزی و ناچاری ناچێتە دەرەوە و پاساودان و پاساونەدانی لە ناکردن و ئاکردنی دووبارەبوونەوە رستەی زمان کە هەست و نەستی مرۆڤ و هۆشیارییە کۆمەڵایەتییەکەی دەردەبڕن شتێکی تر ناگوترێ و نەگوتراوە.

## ئاکار و قانوون

بابەتی ئاکار، کە مەبەست رەوشت جوانی و دەستئەکوینیی و چاکەکاری ..تاد بێت، توندوتۆڵ بە کرداری مرۆڤەوە بەندە. لەو کردارەشدا کە سەر بە خواستی مرۆڤە دوو بابەت لە یەکتری جیا دەکرێنەوە:

- کرداری دەرەکی.
- کرداری ناوەکی.[1]

ئەو کۆششەی بۆ گەیشتنە ئامانجەکە دەکرێ، بابەتی کرداری دەرەکییە. بەڵام بابەتی کرداری ناوەکی ئامانجەکە خۆیەتی.

توماس لە بابەتی ئاکاردا، ئامانجەکەی کردووە بە سەرپشك. بە کردارێك دەگوترێ چاکە، ئەگەر ئەو ئامانجەی سەرگەرمی پێگەیشتنیەتی چاکە بوو. چاکەکاری کردارێك کەوابوو لەلایەن بابەتە

[1] Böhner, Phil. und Gilson, E. Ebenda. S. 546.



هەڵبژێردراوەکەیەوە کە بابەتی خواستی کرداری ناوەکییە دیار و دەستنیشان دەکرێت، ئەمەش ژیر بۆ خواستی بەجێدەهێڵێ. چاکەکاریی بابەتی ئاکارە، چاکەکاریش لە خۆیدا هەڵوێست و داب و نەریت و بە دەنگەوە هاتنە (Geneigtheit)، ژیر چی دەوێ و چۆن دەڵێ ئاوەها مرۆڤ کردارەکەی بکات. چاکەکاری کامڵی و تەواوەتی هەڵوێست و کرداری مرۆڤە. چاکەکارەکان دەکرێن بە دوو بەشەوە:

- چاکەکاریی ژیر و تێگەیشتن.
- چاکەکاریی خواست.

چاکەکارییەکانی ژیر و تێگەیشتن بریتیین لە: زانین، دانایی، ژیریی و زیرەکی. چاکەکارییەکانی خواست و ئاکار ئەمانەن: دادپەروەری، میانڕەویی، ئازایەتی.

ئەم چاکەکارییانە ئەگەرچی سەربەخۆ بێنە بەرچاو ئەوا توندوتۆڵ بەیەکترییەوە بەندن و یەکتری تەواو دەکەن. بۆ نموونە زانین و ژیریی توندوتۆڵ بە داناییەوە بەستراونەتەوە. دادپەروەریی ناوەڕۆك و سروشتی کرداری دەرەکی مرۆڤ رێکدەخات، بەڵام میانڕەویی کرداری ناوەکیی مرۆڤ رێك و پێك دەکات، هەر لە توندڕەوییەوە تاوەکو هەڵچوون و بەلاداهاتن.

ئەم چاکەکارییانە Tugend وەك بنەکایەك پەنایان بۆ دەبردرێ بۆ رێك و پێککردن و رێکخستنی کرداری مرۆڤ. دەشکرێ وەك بابەتێکی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی سەرنج بدرێن.

مرۆڤ بوونەوەرێکە خواستی هەیە و دەتوانێ سەرپشکانە شت هەڵبژێرێ، ئەو خواست هەڵبژاردنە وەك کرداری بابەتی ئاکارن. بەڵام ئەم هەڵبژاردن و سەرپشك بوونە هەمیشە چاکەکاری لێ ناکەوێتەوە، هەندێك جار ئەنجامێکی لێ دەکەوێتەوە بە هیچ جۆرێك ناکرێ بخرێتە نێو خانەی چاکەوە، چونکە خۆی لە خۆیدا نالەبار و بەدکارییە! کەوابوو بەدکاریی چییە و چۆن لەچاکەکاریی جیادەکرێتەوە و بە چ شێوازێك دەکەوێتەوە؟!

دوور نییە وەڵامی ئەکوینی دیار و ئاشکرا بێ، چونکە وەك مەسیحییەکی خاوەن بڕوا و ئیمان پابەند بە دۆگمی ئایینەکەیەتی.

ئایا بەدکاریی لە خۆیدا بوونی سەربەخۆ و تایبەتی هەیە یان ئەو مەبەست و ئامانجەی دیاری کردووە و هەوڵی پێگەیشتنی داوە ئەو تایبەتمەندییەی پێ دەبەخشێ، یان ئەو ئەنجامەی لێیدەکەوێتەوە دەیخاتە نێو خانەی بەدکارییەوە؟!

بەلای ئەکوینی ئەکوینیەوە بەدکاریی لە خۆیدا مەبەست و ئامانج نییە و جەوهەری سەربەخۆی نییە هۆکارەکەشی شتێکی رێککەوتە کە لە بنەڕەتدا هۆکاری چاکەیە.[1]

خواستی مرۆڤ پابەندی ژیریەتی، ژیریش هەمیشە مەیلی چاکەکاری هەیە و هەر ژێر خۆیەتی چاکەکاری لە بەدکاریی جیادەکاتەوە. ئەگەر کرداری خواستی مرۆڤ لەگەڵ بڕیار و حوکمی

(1) Russell, Bertrand., Philosophie des Abendlandes. München. 2000. s. 468.



ژیردا گونجاو و تەبا بوو ئەوە چاکەکاریی دەبێ ، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەی بڕیار و حوکمی ژیرەوە بوو ئەوە بەدکاریی دەبێت. لە کرداری خواستی مرۆڤدا سێ خاڵ بابەتەکە بە لایەکدا دەخەن، ئایا چاکەکارییە یان نا:

**یەکەم:** ئایا بابەتەکە خۆی بە پێچەوانەی ژیرەوەیە یان نا.

**دووەم:** رەوشەکە کە رووکەش و تایبەتمەندی کردارەکە نیشان دەدات بابەتەکە دیار و دەستنیشان دەکات ئایا کردارەکە ئەوەی دەهێنا بکرێت یان نا؟

**سێیەم:** ئەو ئەنجامەی کۆششی بۆ کراوە چییە و چۆنە؟[1].

(1) یوسف کرم، المصدر السابق نفسه، ص169-170.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە عەرەبییەکان:


- اتين جلسون، روح الفلسفة المسيحية في العصر الوسيط. ت: د. إمام عبدالفتاح إمام. مكتبة مدبولي، 1996
- عبدالرحمن بدوى، فلسفة العصور الوسطى، القاهرة، 1962.
- يوسف كرم، تأريخ الفلسفة الاوروبية في العصر الوسيط، دار المعارف بمصر، مكتبة الدراسات الفلسفية، 1957.
- تەورات بە ئەڵمانی ، سفری پەیدابوون:1-2: 2.


## سەرچاوە ئەڵمانییەکان:


- Böhner, Phil. Und Gilson,E., Christliche Philosophie. Bd. 3. 2. Auflage. Paderborn1954.
- Franz Schupp., Geschichte der Philosophie im überblik . Bd. 2. Meiner 2003.
- Eugen Rolfes und Karl Bormann.(Hrsg): Die Philosophie Des Thomas Von Aquin. Felix Meiner verlag . Hamburg 1977.
- Hans, Ulrich Wöhler., Geschi chte der mittelalterlichen Philosophie. VEB. Berlin 1990.





- Hans Joachim Störig., Kleine Weltgeschichte der Philosophie. Stuttgart 1961.
- Johannes Hirschberger., Geschichte der Philosophie. Bd. I. Altertum und Mittelalter. Komet . 1980 .
- Russell, Bertrand., Philosophie des Abendlandes. München. 2000.
- Maurice De Wulf., Geschichte der mittelaterlichen Philosophie. Tübingen 1913.
- Wilhelm Weischedel., Der Gott der Philosophen WB Darmstadt. 1998.
- Wolfgang Röd., Der weg der Philosophie. Bd. I. München . 1994.